چاپی دووەم

# مەبەست و مەرامەکانی

# ئیلحادی هاوچەرخ






د. ئیدریس کاریتانی

## مەبەست و مەرامەکانی ئیلحادی هاوچەرخ

**نووسینی: د. ادریس کاریتانی**



چاپی دووەم ١٤٤١ك - ٢٠٢٠ ز



**نوسینگەی تەفسیر**

بۆچاپ و بڵاوکردنەوە

هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر

کاریتانی، ادریس

مەبەست و مەرامەکانی ئیلحادی هاوچەرخ ، د. ادریس کاریتانی، (نووسەر).

٦٤ لاپەڕە،

١٤* ٢١ سم

بابەت، فیکری

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٣٣٠) ی ساڵی ٢٠١٩ پێدراوە.



دیزاین: عمر عثمان عمر

## بسم الله الرحمن الرحيم

بەناوی خودای گەورەو میهرەبان دانـەری زەوی و ڕاگـری ئاسمـان ، تاك و بیٚ هاوتا ، بیٚ هاوبەش دانان، داهیٚنەری بون ، گەورەی گشـت جیهان، بـەڕەحم و سـوزە لەگـەڵ گشـت ئینسـان ، صـەلات و سـەلام لەسەر پیٚغەمبەر پیٚشەنگ و قدوە قائیـدی هـەموان، تـاروژی دوایـی برِژیٚ بەسەر یارو یاوەران.

## سوپاس و پێزانین

بەپێویستی دەزانم زور سوپاسی ماموستا حمزە بکەم کەپیشنیاری نوسینی ئەم نامیلکەیەی بوکردم لەسەر ئیلحاد، هەروەها سوپاسی ماموستا شهاب و دکتورە خوناو بکەم کە هەستان بەتایپ کردنی نوسراوەکە.

# پێشەکی چاپی دووەم

وشیاری باشترین رێگەی ڕوبەڕوبونەوەی ئیلحادە

دوای ئەوەی لەم نامیلکە بچوکەدا ئەوەمان سەلماند کە میللەتی کورد هەلس و کەوت و کلتورو فەرهەنگی لەگەل ئیسلام و ئیسلام پەروەری تێگەڵ بوە، ئیلحاد لەم هەرێمە قەناعەت و فکر نیە، تەنها بەسیاسی کردنی بابەتەکەیەو جۆرێکە لەفریودان و بازرگانی سیاسی، ئەم هەنگاوە بەرپەرچدانەوەیەکی باش بوو، هەروەها ئەم خەوف و وەهە زورەی تارمایی ئیلحاد و پالنەرانی فکری ئیلحادی دروستیان کردبوو یان بەشیك لەموسلمانە ساویلکە کان زور لیی دەترسان و بەمەترسیەکی گەورەیان دادەنا توایەوە، بەپیشاندانی ئەم بابەتە وەك خۆی و وشیارکردنەوەی تاکەکان باشترین رێگەی روبەڕوبونەوەی ئیلحاد و پشتگیرەکانیەتی، ئەوانەی فکری ئیلحادی لەنێو گومەڵگای کوردەواری بلاو دەکەنەوە زوریان پێ خوشە بەگەورەیی ئەم بابەتە باس بکرێت و قەبارەیەکی فراوانی بدرێتی، تاوا بخویندریتەوە کە میللەتی کورد پێشوازی لەئیلحاد دەکات، لەڕاستی دا ئەوانەی ریکخراوو ناوەندی ئیلحادیان هەیە زۆر جار خۆیان لەبیر دەکەن ناوەڕۆکی خۆیان دەر دەبڕن و پڕ بەزوبانیان دەڵێن

ئێمە موسلمانین، ئیمەش نویژدەکەین، ڕێز لەخەڵکی دیندار دەگرین، ئەگەر سەرقافلەیی ئیلحاد ئەمە ڕاوو بۆچونی بێ، کەواتە ئیلحادی قەناعەت لەکوردستان بونی نیە؟ یان هەر زور دەگمەنە!!!. سوپاس بۆ خودا ئەم نامیلکەیە لەچاپی یەکەم چەند سیمینارو خیوەتگەو راپورتیکی لەسەر نوسرا ، سودێکی بەر چاوی هەبوو لەسەر ئەم بابەتە، وە لەسەر داوای هەندێ خەڵکی دڵسوز داوا کرا چاپ بکرێتەوە، ئومیدمان وایە ئەم هەنگاوەش کەلێنێك لەکاروانی وشیاری و بیداری پر بکاتەوە.

12-11-2019

## پەیڤێك

هەرچەندە ئیلحاد مێژوویێکی دوور و درێژی هەیە لە ڕەوڕەوەی ژیانی مرۆڤایەتی، لە وەتەی مرۆڤ هاتۆتە سەر زەوی کەم تا زۆر ئیلحاد هەر هەبووە، لەوانەیە کۆتایی پیێ نێت تا مرۆڤ لەسەر زەوی کۆتایی پێ دێت ، یەکێك لە هۆکارە هەرە سەرەکیەکانی هاتنی ئەم ڕێژە زۆرەی پێغەمبەران ( سەلامی خودایان لیێ بیێ) بۆ مرۆڤایەتی بەگشتی نەهێشتنی ئیلحاد بووە، جیهانی ئیسلامی لە دوای هاتنی وەحی بوە کانگای هاتنی پێغەمبەران بەگشتی بۆیە ئەم ناوچەیە کەمترین ڕێژەی ئیلحادی بەخۆیەوە بینیوە، بەهۆی دابەزینی سەرجەم پەیامەکان لەم شوێنەوە وای کردوە پێغەمبەران بەدوای یەکدا هاتون، هیچ کاتێك ئەم شوێنە خاڵی نەبووە لە بوونی پێغەمبەرێك یان زیاتر، مرۆڤەکانیش هەتا لە پەیام و پێغەمبەران نزیك بن دوورتر دەبن لە ئیلحاد و نزیکتر دەبن لە تەوحید.

ئەگەر سەردەمێکیش ناوچەکە بێ پێغەمبەر بوو بێت خەڵکەکە لەسەر پەیامی پێغەمبەرێکی پێشوو ڕۆیشتوون، یان بەشێکیان هاوبەشیان بۆ خودا پەیدا کردووە و لەگەڵ خودا شتێکی تریان

پەرستووە بەڵام نەگەیشتۆتە ئیلحاد، کوردستانیش لە دوای هاتنی وەحی بۆ ناوچەکە دانەبڕاوە لە پەیامە پیرۆزەکانی ئاسمان بەتایبەتی پەیامی ئیسلام، هەر زوو تێی گەیشتووە و قبوڵی کردووە، بۆیە لەدوای هاتنی ئیسلام کوردستان دەتوانین بڵێین بە تەواوی خاڵی بووە لە فیکری ئیلحادی و تەنانەت ئەم فیکرەیە زۆر نامۆ بووە لەنێو کۆمەڵگای کوردەواری.

کلتوری کوردەواری تەواو لەگەڵ ئاداب و ئاکار و بەهاکانی ئیسلام هاوڕاو بووە و لێك جیا نەبووە، بەڵام دوای ڕووخانی سیستەمی سیاسی ئیسلامی لە ساڵی ١٩٢٤ و ، شوێن گرتنەوەی سیستەمی عەلمانی، جیهانی ئیسلامیش وەك ڕۆژئاوا کەوتە بەر شەپۆلی جۆرەها بیرۆکەی جیاواز و لاڕێ و لادەر لەنێوانیاندا بیرۆکەی ئیلحاد، بەهۆی داگیرکاری فکریی بەهێز لەلایەن زلهێزەکانەوە، هەروەها دانانی دەیان سەرۆکی دروستکراوی دەستی ڕۆژئاوا لە وڵاتانی ئیسلامی ، وە بەناوی ئیسلامەوە دەیان کردەوەی ناشیاوو ناڕێکیان نیشانی موسڵمانان دا تا ئیسلام لەبەر چاوی کومەڵگا ناشرین بکەن، هەزار کاری ناڕەواو نا پەسندیان بەناوی ئیسلامەوە کرد، بەنمونە حیزبی بەعس لە عێراق هێزێکی عەلمانی بوو کەچی خەڵکی قەتڵ و عام دەکرد ناوی دەنا ئەنفال، واتا بەناوی سوڕەتێکی

قورئانی دەکرد!!!، زۆرێك لە جەنگەکانی بەناوی خالیدی کوڕی وەلید و سعدی کوڕی أبی وقاص و صەحابە بەڕێزەکان دەکرد، وای نیشان دەدا ئەمە ئیسلامە لەلایەکی تریشەوە فیکری عەلمانیان بڵاو دەکردەوە و خەڵکیان بەرەو لاڕێی بوون و ئیلحاد دەبرد.

بەم جۆرە وردە وردە لە ئەنجامی پەرچەکرداری ئەم کارە قێزەونانە بەناوی ئیسلام، لاڕێی و لادان و کەمێکیش ئیلحاد سەری هەڵدا. لە دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ ڕامالێنی ڕژێمی عەلمانی بەعسی دوو حیزبی دەسەڵات، جڵەوی هەرێمی کورستانیان گرتە دەست، چونکە ئەوانەش وەك سەرکردەکانی جیهانی ئیسلامی ژێردەست و دروستکراوی ڕۆژرئاوا بوون، نەیانتوانی خۆ لە چەتری ڕۆژئاواو فیکری عەلمانی ڕزگار بکەن.

هەروەها بەهۆی شکستی بیری عەلمانی لە جیهانی ئیسلامی و شاردنەوەی شکستەکەیان لەڕووی فیکریەوە، وە دەست کردن بە بردن و تالآن کردنی سامان و داهاتی میللەت، دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی بیری عەلمانی و بەلاڕێ دا بردنی تاکی کورد، لێرەوە بەرێژەیەکی زۆر کەم فیکری ئیلحادی سەری هەڵدا، هەر چەند من وای دەبینم بیری ئیلحاد لە کوردستان قەناعەت نیە و زیاتر پەردەپۆشی عەلمانیەتە، و پڕکردنەوەی شکستەکانە بەتایبەتی بەشێك

لە سەرکردە سیاسیەکان کە بوونەتە دار دەستی ڕۆژئاواو لەنێو خەڵك و جەماوەر هیچ پێگەیەکیان نەماوە تا ناویان ببردرێت و هەست بەبوونی خۆیان بکەن، بەهێزترین ئاین کە قسەی لەسەر بکەن ئەوا ئیسلامە تا بڵێن ئێمە هەین.

لەگەڵ ئەم ڕاستیەش بۆ بەرگرتن لە هەر دیاردەیەکی ئیلحاد و برایانی بەشی( توێشووی قەڵەم)، دەستیان خۆش بێت هەستاون بە وروژاندنی ئەم بابەتەو لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن، داوایان لە بەندە کرد لێکۆڵینەوەیەکی فیکری لە بارەی مەبەست و مەرامەکانی ئیلحادی هاوچەرخ بنوسم، منیش بەسوپاسەوە قبوڵم کرد و بەم لێکۆڵینەوەیە پشت بە خودا بەشداریم کرد تا ببێتە بەرچاو ڕوونیەك بۆ گەنج و تاکەکانی کورد و ئومێد دەکەم ببێتە سەرچاوەیەکی باش لەدیاری کردنی مەرامەکانی پشت ئیلحاد و قەبارەی بچوکیان إن شاء الله.

د. إدريس كاريتانی

٢٠١٩/٣/١٢

## دەستپێکی ناسینی ئیلحاد

هیچ زاراوەو چەمکێك شی ناکرێتەوە تا پێناسەو شوناسی دیاری نەکەین، بەڵام چونکە لێکۆڵینەوەکەی ئێمە زیاتر لەڕوە فکریەکەیەوە ئیلحاد شی دەکەینەوە، زۆر رەچاوی مەنهەجی زانستی مان نەکردوە، بۆیە ڕاستەوخۆ دەستپێکێکی کورت لەسەر ناسینی ئیلحاد باس دەکەین، پێناسەو ناسینی وشەی ئیلحاد نیوەی تێگەیشتنە لەبابەتەکە.

### وشەی ئیلحاد:

وشەی ئیلحاد وشەیەکی عەرەبی ڕوان، بەڵگەیە لەسەر لادانی هەر شتێك لەڕێگای ڕاستی خۆی. کاتێك بڵێن پیاوەکە لای داوە واتە لەڕێی ڕاستی و حەق و ئیمان لایداوە.

بەلێدانی شێوازیکی نێو گۆڕ دەڵێن ئەلحەد، چونکە لەلایەکی گۆڕەکەوە بن قوڵ دەکرێت نەك لەناوەڕاستی[١].

[١] بڕوانە: معجم مقاييس اللغة، لابن فارس (٥-٢٣).

کەواتە ئیلحاد لادانە لەڕێگەی راست و دروست، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يُرِدۡ فِيهِ بِإِلۡحَادِۭ بِظُلۡمٖ نُّذِقۡهُ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴾[٢]. واتە: وە هەرکەسێك لەمزگەوتی (حەرام) لەڕێی ڕاست لا بداو کاری ناپەسەند بکا، هاوبەش بۆ خوا پەیدا بکا سزایەکی زۆر ئێش پێگەیەنەری پێ دەچێژین.

کەواتە بەکورتی ئیلحاد زاراوەیەکی گشتی یە بۆ رەوتیکی فکری و فلسفی بەکاردێت کە لەچوارچیوەی رەتدکردنەوەی بونی خودا دەسوڕێتەوە.

بە شێوازێکی ساکارتر ئیلحاد واتە انکاری کردنی بونی خودا لەبەر نەبونی بەڵگەی زانستی پێوسیت.

## چەقی ئەم بیرۆکەیە

تاکە بەڵگەی مولحیدەکان لەسەر ئینکاری کردنی بونی خودا نەبونی بەڵگەی سەلمێنراوە لەروی زانستیەوە، گوایە هەر شتێك بە تەجروبەی زانستی نەسەلمێندرێت یان لەرێی هەستیارەکانەوە هەستی پێ نەکرێ نابێ مرۆڤ بڕوایان پێ بکات، لەبەر ئەوە دەبێ بڕوا بەبونی

---

[٢] الحج: ٢٥.

خودا نەهێنی مادام زانست بۆی نەسەلماندوین ئەم بۆ چونەش لە چەند روێکەوە هەڵەیە و پێچەوانەی ڕاستی و زانستی سەلمێندراوە لەوانە:

١- هەر بەپێی بەڵگەی سەلمێندراوی زانستی مرۆڤ عەقڵ و تەواوی هەستیارەکانی سنوردارە و بێ سنور نیە .

٢- عەقڵ و هەستیارەکانی مرۆڤ ناتوانی درك بەهەموو ڕاستیەکان بکات بەڵکو زۆر جار لەبەر کەمی توانای راستیەکان دەشێوێنی.

٣- چاوی مرۆڤەکان ناتوانی هەموو شتێك ببێنێ بە نمونە ناتوانی بەکتریاو ئەمیبا و ڤایرۆس ببینی، دەبێ پەنا بباتە بەر مایکروسکوب . هەروها ناتوانی شتە وەردەکانیش ببینێ تەنها بە تلسکۆپ نەبێ کەواتە سنوردارە.

٤- هەندێ باڵندە هەیە توانا یان لە چاوی مرۆڤ زیاترە باڵندەی کەناری هەموو جۆرە رەنگەکەکان دەبینێ، بەڵام مرۆڤ ناتوانی بیان بینێ.

٥- باز توانای هەیە کەروێشك لە نێو پوشو پەڵاش ببێنی لە بەرزایی سێ کیلومەتر، چونکە چاوی توانای هەیە وێنەکان ( ٨ )

جار بەقەدەر خۆی گەورە بکات کەچی مرۆڤ ئەم توانایەیی نیە .

٦- گوێی مرۆڤ توانای کەمترە لە گوێ گرتنی لە بەشێکی زۆر لە گیاندارەکان، وەك سەگ و ئاسك، هەر یەك لەوانە گوێیان لە لەرەلەری زەوی لەرزین دەبیٚ بە دە خولەك پێش رودانی .

٧- هەستیارەکانی مرۆڤ هەلٚمان دەخەلٚەتێنن لە بیابانەکان سەراب دەبینن وا دەزانین ئاوە!. قەلٚەمێکی راست و دورست لە نێو ئاو بەخواری دەبینین. ئەمانە لە ڕوی زانستیەوە دەیسەلمێنن کە زانست و عەقلٚ و هەستیارەکان نابنە سەرچاوەی تەواو بۆ تەواوی زانیاریەکان چونکە تەواوی تواناکانی مرۆڤ سنوردارە .

## لاوازی بەڵگە زانستیەکانی ئیلحاد:

لەبەر لاوازی بەلٚگەکانی ئیلحاد لەروی زانستیەوە ، بەتایبەتی دوای گەشەی زانستی و تەکنەلۆجیای سەردەم بۆمان سەلمێندراوە تا زانست لاواز بیٚ ریژەی ئیلحاد لەبەرزبونەوە دایە وە زانست فروان و قولتر ببیتەوە ئیمان لە گەشەدایە.

- فرانسیس بیکون :دەلێت ( ان القلیل من الفلسفة یمیل بعقل الانسان الي الإلحاد ولكن التعمق فیها ینتهي بالعقول الي

الايمـان)[٣]. واتــە : كـەمی زانیـاری فەلسـەفی و عـەقلی مرۆڤـەكان بەلای ئیلحاد دا دەبات، بەلاّم قولبونـەوە لـە زانسـت لـە كۆتاییـدا عـەقڵ دەگەیێنێتە ئیمان .

- نیافـة الأنبـا غریفوریـوس دەلێـت: (الإلحـاد المعاصـر لـیس الحـاداً عقلانیـا ولا فلسـفیا ولا منطقیـا ولاعلمیـا، انمـا هـو الحـاد تصـمیم تصمیم بالرفض لفكرة الله ..... و ذلك بسبب خبرة حزینة عن بعـض الافراد او عـنـد بعـض الشـعوب ، خـبرة مؤلمـة وقاسـیة عـن الـدین و المتدینین او عـن الملوك و الحكام الذین یتخذون الدین غـلافا یغلفون به تصرفاتهم و یشدون فیها كذبا و بهتانا الی الله)[٤].

واتە : ئیلحادی سەردەم ئیلحادێكی عەقلانی و فەلسەفی و لـۆژیكی و زانسـتی نیـە، بـەڵكو تـەنها دیزانێكـە دیزاینـی ڕەت كردنـەوەی خودایە، ئەمـەش بەهۆی بونی فكری لاواز لای هەندێ تـاك ، یـان لـە لای هەندێ گەل، ئەزمونێكی كەم و كـورت بیـنن، بـەئازارو وشـك، بەرامبـەر ئایین و ئاینداركان ، یان بەرامبـەر بە مـەلیك و حاكمەكانی ئەوانـەی دیـن وەك بـەرگێك بـەكار دەهێـنن بـۆ كـارە ناشـیرینەكانی خۆیان بە درۆ و بوهتان دەیدەنە پاڵ خودا.

---

[٣] بروانه : الالحاد فی الغرب ص٥٨.
[٤] بروانة: الالحاد المعاصر وكیف نجابهة ص١٧.

## مولحید کێیە؟

مولحید ئەو کەسەیە کە لەڕێی ڕاستی ئیسلام و ئیمان لای داوەو بڕوای بەخودا نیە.

خودای گەورە دەفەرمویێت : ﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ [٥].

واتە: ناوەکانی خوا هەموو جوان و پڕشکۆن دەسا ئێوەیش هەر بەو ناوانەوە بانگی بکەن، لاڵەو نزاو داواهەر بەوانە بکەن. لەوانەگەڕێن دەس وەردەدەن لەناوەکانی خواو بەدەس ئەنقەست دەیانگۆڕن، دڵنیابە ئەوانە بە تۆڵەی کردەوەی خۆیان ئەگەن.

-لە عبداللە ی کوڕی عەباسەوە خودا لێی ڕازی بێ نەقل کراوە دەفەرموویت ئیلحاد واتا بە درۆخستنەوەو هاوبەش دانان، کاتێك دەلێن (يُلۡحِدُونَ ) واتا (يُشركون). دوای دەڵێت بنچینەی ئیلحاد لە قسەی عەرەبەکان لادانە لە مەبەست[٦].

[٥] الأعراف: ١٨٠.

[٦] بروانە: جامع البيان عن تأويل آية القران (١٣-٢٨٣).

بەم تەفسیرانە بێت ووشەی ئیلحاد لە قورئاندا بەمانای هاوبەشی دانان و بەدرۆ خستنەوە هاتوە.

وشەی ئیلحاد لە سورەتی النحل :﴿ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلۡحِدُونَ إِلَيۡهِ أَعۡجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴾ (٧).

هەروەها لەسورەتی فصلت دا دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخۡفَوۡنَ عَلَيۡنَآ ﴾ (٨).

وە چەند شوێنکی تر هاتوە دەردەکەوێت ئیلحاد بەم ناوو مەبەستەی ئێستا و سەردەم نابێت و جیاوازە .

## ئیلحاد لە مێژوی مرۆڤایەتی:

گەڕانەوە بۆ دیاری کردنی سەرەتای دروست بونی ئیلحاد ئاسان نیە، هەرچەندە بە ئاسانی لەسەر زوبانی زۆرمان دەگوترێت لەوەتەی مرۆڤ هەیە ئیلحادیش هەبوە!، بەلاٌم قورئان چۆن سەرچاوەیەکی سەرەکیە بۆ تەواوی ژیانمان، بێگومان بۆ گەڕانەوەو دیاری کردنی

(٧) النحل: ١٠٣ .
(٨) فصلت: ٤٠ .

مێژوی ئیلحادیش زانیاری وردمان دەداتێ، پێمان دەڵێ ئەم جۆرە ئیلحادەی سەردەم لە پێشدا بەم مانایە نەبوە.

بۆ نمونە ئەم کەسایەتیانەی قورئان باسیان دەکات کە لایانداوە ولارێ بون وشەی ئیلحادی بۆ بەکارهێناون، بەلاّم بەواتای هاوبەشی دانان و بڕوابوون بەچەند خودایەك نەك نەبونی خودا، بۆ نمونە خودای گەورە دەفەرمویت: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾ [٩].

واتە: ئەگەر لەو بێ باوەڕانە بپرسیت: کێ ئاسمانەکان و زەویی دروستکردووە و، خۆرو مانگی ڕامکردەووە" ئابەو شێوەیە بە ئاسانی بێن و بچن بێ سێ و دوو دەڵێن: هەر خوایە ئەو کارانەی کردووە دەسا ئیتر چۆن لە یەك خوا پەرستیی لادەدرێن و بەرەو بتپەرستی ئەبرێن!.

بەپێی ئەم مێژوە قورئانیە بیرۆکەی ئیلحاد بەواتای نەبونی خودا بونی نەبوە لە مێژوی مرۆڤایەتی!! چونکە مرۆڤ بە فیترەت و سروشتی خۆی دان بەبونی خودا دەنێت، ئەوانەی قورئان باسیان دەکات هاوبەشی دانەربون هۆکارەکەی مل هۆڕی و خۆ بەگەورە زانین

[٩] العنكبوت: ٦١.

بوه نەك دان نەنان بەبونی خـودا: ﴿ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ [١٠].

واته: وه لەناخی دەروونیاندا متمانەو یەقینیان هـەبوو بەراسـتیان نكولّییان كردن لەرووی ستەمكاریی و خۆ بەزل زانینەوه نەك لـەڕووی هەق و راستیەوه جا تۆیش سەیر بكـە پاشـەرۆژی خراپكارەكـان چـۆن بوو.

-مێژونوسی بـەناوبانگی ئیغریقـی ئەمـە پشـت راسـت دەكاتـەوه دەڵێت: ( لقد وجدت في التاريخ مدن بلا حصـون، ومـدن بـلا قصـور، ومدن بلا مدارس، ولكن لم توجد أبدا مدن بـلا معابـد )([١١]). واتـە: مێژوی مرۆڤایەتی خۆی بینیوه بەشاری بێ قەلاّ، شاری بێ كۆشـك و تەلاری بەرز ، شاری بێ قوتابخانه، بەلاّم قـەد شـارێكی بـە خـوًوه نـە بینیوه بە بێ شوێنی پەرستگا.

ئەمـەش بەڵگەیەكی ڕوونی مرۆڤایەتییە ئەگەر بەشێكیش تووشـی هاوبەشی دانان بوو بێ بەلاّم خودای هەر ناسیوەو وپەرستویەتی.

---

[١٠] النمل: ١٤.

[١١] بروانه: مجله الوعى الاسلامى الكويتيه العدد(٥٧٧) مقال بعنوان هل حقا الدين افيـون الشعوب.

لەگــەڵ ئــەوەی زۆرینــەی لێکۆڵــەران و ڕۆژهەڵاتناســەکان لــە نووسینەکانیاندا ئاماژە بـەوە دەکـەن کـە ووشـەی ئیلحـاد وشـەیەکی ئیغریقی کۆنە پێیٚ گووتراوە (atheos)، لـە لای یۆنانیـەکان بـەکار هاتووە لە بەرامبەر واتای (بڕوا نە بـوون بـە هـیچ خودایـەك)، وە لـە چەرخی پێنجەمی پێش زاییـنی واتـایێکی تریـان بـۆ زیـادکردووە کـە (ئیلحاد) واتا ئینکاری کردنی خودای گەورە.

بەڵام بە گەڕانەوەمان بۆ قورئان بۆمان دەردەکەوێت کە (ئیلحـاد) پیش یۆنانیەکان هەبووە و شەیتان یەکـەم (مولحیـد) بـووە لـە مێـژوو خــودای گــەورە دەفــەرموێت: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ [١٢].

واتــە: ئــەی پێغەمبــەر! ئەودەمــەیان وەبــیر بێنــە کەئێمــە بەفریشــتەکانمان گــوت: ســوژدەو کڕنــووش بەرنــە بــەرئادەم ئینجــا ئــەوانیش دەســت بــەجێ کڕنووشــیان بــرد ، شــەیتان نــەبێت ئــەو سەرپێچیکردو خۆی بەزلزانیی و بوو بەیەکێ لەبێ باوەڕان.

هــــەروەها: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ

[١٢] البقرة: ٣٤.

كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ ﴾ (١٣). واتە: ئەو رۆژگارە وەبیر بێنە کە بەفریشتەکانمان گوت: سوژدە بۆ ئادەم بەرن، دیارە کەمەبەست لەو سوژدەیە، سوژدەو کڕنوشی ڕێزە، نەك سوژدەی پەرستن ئەوانیش هەموو دەست بەجێ فەرمانەکەیان پیادە کردو کڕنووشیان برد، (شەیتان) نەبێ ئەو لە(جن) بوو لە فەرمانی پەروەردگاری خۆی دەرچوو.

بە پێی ئەم ئایەتانە شەیتان یەکەم تۆی ئیلحادی چاندووە لە مێژوو.

-خودای گەورە شەیتانی وەصف کردووە بە کافر وفاسق، ئەمانەش هەر دوو سیفەتن بۆ لادان ولاڕێبوون و شاردنەوەی حەق بەکاردێت، شەیتان دوای ئەوەی لەرێی ڕاست لا دەدات و (مولحید) دەبێت و دەلێت ئەوانی تریش لاڕێ و گومڕا دەکەم :﴿ لَأَقۡعُدَنَّ لَهُمۡ صِرَٰطَكَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ (١٤). واتە: ئەوجا شەیتان کەوتە ململانێ وعینادەوەو وتی: چونکە گومڕات کردم، شەرتبێ ڕێ ڕاستەکەی تۆیان لێبگرم.

---

(١٣) الكهف: ٥٠.
(١٤) الأعراف: ١٦ .

کەواتە شەیتان یەکەم بوونەوەرە کە بانگەشەی بۆ ئیلحاد کرد، شەیتان بوو نەك ئیغریقی و یۆنانییەکان.

یەکێك لە (مولحیدە) سەردەمییەکان دەڵێت (أنا لا انکر وجود الإله ولکني لا أؤمن بوجود الإله!!). واتە: من ئینکاری بوونی خودا ناکەم بەڵام باوەڕم بە بوونی خودا نییە. کەواتە (ئیلحاد) لەم سەردەمەدا سیفەتێکە بۆ هەر کەسێك بڕوای بە بوونی خودا نەبێ وئینکاری دروستکاری مرۆڤ وبوونەوەر بکات کە خودایە.

## هۆکاری سەرەکی سەرهەڵدانی ئیلحاد لەڕۆژئاوا:

بۆ ئەوەی بزانین ئەم هوکارانەی بوە هوی سەرهەڵدانی ئیلحاد لە ڕۆژئاوا زۆر جیاوازە لەهەریمی کوردستان و ئەم هوکارو پاڵنەرانە بونیان نیە لێرە بەکورتی باسیان دەکەین:

١- زوڵم و ستەمی پیاوای کەنیسە و حوکمی کوردراوی کەنیسە هوکاری سەرەکی بون بۆ سەرهەڵدانی بیری ئیلحاد.

٢- لادان و گوڕینی ئاییینی نەسرانی کە ئەو کات ئاینی سەرەکی رۆژئاوا بوو.

٣- زۆر بونی کێشە و گرفتی کومەلآیەتی تێك چونی شیرازەی کۆمەڵگا ، لادان و لاڕێی.

٤- سەر هەڵدانی کۆمەڵێك نوسەر لەڕوی دەرونیەوە نەخوش و ناتەواو.

٥- قوناغی جەهالەت و نەزانی و تێپەڕاندنی بارو زروفێکی ناعەدالەت و نادادگەری لەنێو چینەکان.

**٦- نەبوونی ئاینێکی ڕاستەقینە لەرۆژئاوا. لەگەڵ چەند هوکاریکی تر بێ گومان ئەمانە هیچیان بونیان نیە لەکوردستان بۆیە ئیلحاد لەهەریمی کوردستان قەناعەت نیەو سەر ناکەوێ.**

## ئەمرۆ کێ لە پشتی ئیلحادە؟

کۆمەڵێك ڕێگامـان بـاس کـرد بـۆ بڵاوبونـەوەی فکـری ئیلحـادی لەجیهانی ئیسلامی بەڵام ئایا ئێستا کێ پالپشتی دەکات و کاری بـۆ دەکات ؟

بـێ گومـان تـەواوی حیزبـە علمانیـەکان لـە جیهـان بـە گشـتی و ڕۆژهەلاتی ناوەراست بەتایبەتی پاڵپشـتی ئیلحـادن و بانگەشـەی بـۆ دەکـەن، ئینجـا راسـتەو خـۆ بێـت یـان ناراسـتەوحۆ ، جگـە لەمانـە کۆمــەڵێك دەزگــا و راگەیانــدن و ڕێکخــراوەی جیهــانی لــە پشــت بڵاوکردنەوەی بیری ئیلحادن لەوانە:

١- هـاو پـەیمانی نێـو دەوڵـەتی مولحیـدەکان (التحـالف الـدولي للملاحدة).

٢- سەندیکای مولحیدەکان (رابطة الملحدين).

٣- دەزگـای ریتشـارد دوکنـز بـۆ پاڵپشـتی عـەقڵ و زانسـت ( مؤسسة ريتشارد دوكنز لدعم العقل و العلم ).

٤- یــەکێتی نێودەڵــەتی بــۆ ئاراســتە کردنــی مرۆڤایــەتی و ئەخلاقی، (الاتحاد الدولي الاتجاه الانساني و الاخلاقي ).

٥- سەندیکای نێو دەوڵەتی بۆ بێ دین و موڵحیـدەکان، (الرابطـە الدولیە لغیر المتدینین و الملحدین).

ئــەم دەزگــا و رێکخــراو و ســەندیکایانە بــەپارە و مــاڵ و ســامان یارمەتی و پشتکیری ئیلحاد دەکەن لەگەڵ چەندان جۆر و شیوازی تــر لە جیهاندا هەیە.

## دیاترین کتێبە ئیلحادیەکانی سەردەم:

لــە دوای روداوی ١١ ی ســبتیمبری ســاڵی ٢٠٠١ ، کۆمــەڵێك کتێــب لەســەر ئیلحــاد دەرچــوو بــۆ زیــاتر قۆزتنــەوەی کاتەکــەو فراوانکردنی بازنەی ئیلحاد و برەودانی فکـری ئیلحـادی، بـۆ بەرچـاو ڕون تـر خوێنـەر ئامـاژە بـەناوی کتێـب و نوسـەرەکانیان دەکـەین تـا موسلمان بەرچاوی روون بێت، بزانـێ ئـەم نوسـراوانە بـە پاڵپشـتێکی زۆری زلهێزەکان نوسراوە، مەرامیشیان بلاۆ کردنەوەی بیری ئیلحادیـە نەك زانست.

١- نهاية الايمان : الدين و الارهاب و مستقبل العقـل، نوسـەر : سام هارس .

٢- مانفستو الالحاد — فەیلەسوفی فەرەنسی میشیل او نفری .

٣- وهم الاله- ریتشاد داوکنز.

٤- الله الفريضة الفاشلة - زانایی فیزیایی فیکتور ستنجر.

٥- التصميم العظيم ،اجابات جديدة عن اسئلة الكـون الكـبري- دوو زانایی فیزیایی ستیڤن هۆ کینج- ولیوناردو ملودینوو.

ئـەم چـەند پەرتوکـە لـە دیـاترین کتێبەکانـە لـە بـواری ئیلحـادی سەردەم نوسراوە.

## جۆرەکانی ئیلحاد، ئایا ئیلحاد چەند جۆری هەیە؟

چەمك وزاراوەکان بۆ هەر سەردەم وکات وشوێنێك گوڕانکاریان بەسەردادێت لە کاتی بەکارهێنانیدا، لە ئێستادا چەمکی (ئیلحاد) بەکاردێت بۆ ئەو کەسانەی کە بڕوایان بە بوونی خودا نییە، یان بڕوایان پێ نەهێناوە، بەلاّم بە پێی بەڵگە قورئانییەکان لەپێشدا (ئیلحاد) بەکارهاتووە بۆ هەموو جۆرە بڕوانەهێنانەکان بە خودا، بۆیە بە پێویستی دەزانم بە کورتی باسی جۆرەکانی ئیلحاد بکەم لەم خالانەدا:

### یەکەم: ئیلحادی فیکری:

جیهانی ئیسلامی بۆ ماوەی سەدەیێکە کەوتۆتە بەر شالاًوێکی فیکری بەهێز لەنێوانیاندا ئیلحادی فیکریە، ئەم جۆرەیان سەرچاوەکەی دەگەڕیتەوە بۆ فەلسەفەی ئیغریقی و یۆنانی، کاتێك گومانیان لە هەموو شتێك دروست کرد. ( گومانیان لە پێناو گومان دروست کرد بەتایبەتی ئینکاری کردنی غەیبیات کەناویان ناوە (میتافیزیقیا)، واتە: ئەوەی دواوەی سرووشت لە ڕووی ماددییاتەوە،

دواتر گومانیان لە هەموو شتێك پەیداکرد. چونکە گومان لای ئەوان لەسەر بوونی خودا سەردەکێشێ بۆ (ئیلحاد)، ئەوان لە چوار چێوەی بازنەیەکی بێ سنوور دەسوورێنەوە (بروتاجوراس) دەلێت: (من نازانم ئایە خودا بوونی هەیە یان نا؟ چونکە بابەتەکە لای من نادیارە و تەمەنیش کورتە).

ئەم جۆرەیان ئیلحادی فیکرییەو خۆشیان نەگەییشتوونەتە هیچ رێککەووتن و ئەنجامێك.

## دووەم: ئیلحادی عەقلی:

ئەم جۆرەیان دەرهاویشتەی (ئیلحادی) فیکرییە بەتایبەتی لەدوای ئەم هەلآنەی کە کەنیسە بەناوی ئایینەوە کردی، شۆرشی فەرەنسی لێکەوتەوەو بەتەواوی لە ئایین دوورکەوتنەوەو هەموو شتێکیان بە ماددە سپارد، عەقلیشیان کردە سەرچاوەی زانست و زانیاری بۆ هەموو شتێك دەگەڕانەوە بۆ عەقڵ، ئەوەی عەقڵ درکی پێ بکات و موافقی بێ ئەمە لای ئەوان راستە، ئەوەی عەقڵ درکی پێ نەکا ئەوە هەڵەیە لای ئەوان و دانی پێدا نا نێن، کە واتە بڕوا بوون بە خوداش عەقڵ درکی پێ ناکات دەچێتە غەیبیات (شاراوەکان)!!! وە

بڕوای پێ ناهێنن بەمەش تووشی ئیلحادی عـەقلی بوونـە و ئەمـەش زۆرترین جۆری ئیلحادە.

ئەم جۆرە هەر چەندە من وای دەبینم بـە تایبـەتی لـە کوردسـتان بەشێکی زۆر خۆیان ناو ناوە مولحید هیچ لە بنەماو بنچینەی ئیلحاد نازانن!، یا وەك بەبەغا دەیلێنەوە و یـان ئـەوەتا مەبەسـتێکی تریـان لەم بابەتـە هەیـە، بەهـەر حـاڵ مـرۆڤ بـە گشـتی هـەموو تواناکـانی سـنووردارە، بێگومـان عـەقلیش هـەر سـنووردارە ناتوانێـت درك بەهـەموو راسـتییەکان بکـات، کەچـی زۆر ڕاسـتیش بـوونی هەیـە و عەقڵ درکی پێ ناکات، ئیمامی شافیعی زۆر بە ووردی ئەم بابەتـەی شـیکردۆتەوە، فەرموویـەتی: (إن للعقـل حـدا ينتهـي إليـه، كمـا أن للبصـر حـدا ينتهـي إليـه). واتـە: بەڕاسـتی عـەقل سـنوورێکی دیـاریکراوی هەیـە و لـەوێوە کۆتـایی توانـای دێـت، هـەروەك چـۆن چاویش سنوورێکی دیاریکروای هەیە کە لـەوێوە کۆتـایی دێـت. ئـەم جۆرەیان هەموو شتێکی بە دونیای ماددە بەستاوەتەوە دوورە لە بڕوا بوون بە غەیبیات.

## سێیەم: ئیلحادی نەزانین:

بەشێکی زۆر لە ئیلحادی سەردەمی ئێستا لەم جۆرەیە یان وەکوو تووتییەك گوێی لێبووەو دەیلێتەوە یان بەدوای ناو بانگ و بەرژەوەندی خۆی دەگەرێ، هیچیش لەبارەی ئیلحاد نازانێ

-لاساییێکی کوێرانە دەکەنەوە وەك قورەیشییەکانی سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله علیە وسلم): ﴿ بَلْ قَالُوٓاْ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴾ (١٥).

واتە: بەڵکو هیچ بەڵگەیەکیان نیە، ئەوە نەبێ کەدەڵێن : ئێمە باوو باپیرانمان لەسەر ئایین و مەزهەبێکی ئاوادیوە بەڕاستی ئێمەیش بەشوێن ڕێبازی ئەواندا ڕێنموون ئەبین و هەنگاو هەڵ ئەگرین.

بە بێ ووردبوونەوەو بیرکردنەوە کاتێك پرسیاریان لێ دەکەی دەڵێن: ﴿ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ قَالُواْ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴾ (١٦). واتە: ئەوکاتە کە بە باوکیی و نەتەوەکەی خۆی گوت: ئەم بت و پەیکەرە بێ گیانانە چین

(١٥) الزخرف: ٢٢.
(١٦) الأنبیاء: ٥٢ ـ ٥٤.

ئێـوە هـەردەم لەبـەریان کـەوتوون، لەوەڵامـدا وتیـان: بـاوو بـاپیرانی ئێمەش هەر ئەمانەیان دەپەرست، بۆیـە ئێمـەش لاسـایی و پـەیڕەوی لەوان ئەکەین.

ئەمەش باشترین ناوبونی ئیلحادی نەزانینە[١٧].

## جۆری چوارەم : ئیلحادی دەرونی:

ئەم جۆرە ئیلحادە سەرچاوەکەی لەوەسوەسەی شـەیتانەوە دەسـت پێ دەکـات و سەردەکێشـی بـۆ ئیلحـاد، ئەگـەر خاوەنەکـەی بـەدوای وەسوەسە بکـەوی، پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) ئـەم جـۆرەی دیاری کردوە و چارەسەریشی بۆ داناوە دەفەرموێت : ( يأتي الشيطان احدكم فيقول من خلق كذا ؟ من خلق كذا؟ حتي يقول من خلـق ربـك ؟ فاذا بلغَهُ فليستعذ بالله ولينته) رواه البخاري.

واتە: شەیتان دیتە لای هەرێکێکتان دەلێـت کـێ ئـەوەی دورسـت کردوە ؟ کێ ئەوەی دروست کردوە؟ تـا دەلێـت کـێ پـەروەردگارتی و دروست کردوە؟ ئەگەر ئەوەتان پێ گەیشت بلێن پەنا دەگرین بە خودا باواز بێنێ لەوە.

[١٧] بڕوانە: خلاصة العتاد في مواجهة الإلحاد أحمد خالد الطحان ص ٣٨.

## جۆری پێنچەم : ئیلحادی زانستی:

خـاوەنی ئـەم جـۆرە بیرۆکەیـە بڕوایـان بـە تیـوری زانسـتی و پێشکەوتنی سەردەم هەیە، واتـە هـەموو شـتێك لـەرێی دۆزینـەوە ( اکتشافا) تی زانستی قەبول دەکەن، هەر شتێك زانست نەی دۆزێتەوە ئەوان دانی پێدانانێن ، لـەلای ئـەوان مـادە حەقیقـەتی سـەرەکیە لـە بـون، هـەموو شـتەکان لـە ژێـر یاسـاکانی سروشـت و فیزیـایی و کۆمەلایـەتی دەناسـنەوە، بـەم پێـوەرە یاساییەوە دەڵـێن ژیـان دەڕوا بەرێوە پێویستی بە بونی خودا نیە مادام یاسا هەیە. وەك لـە پێشـدا ئاماژەمـان پـێ کـرد لـە سـەردەمی ئێسـتا زانسـت نـەی توانیـوە مولحیدەکان بگەیەنیتە کەناری ئارامی و بەڵگەی پێویستی زانستی .

## جۆری شەشەم: ئیلحادی ئە نسرۆ پۆلۆجی و زانستی مرۆڤەکان:

ئەم جۆرە ئاراستە ئیلحادیە زیاتر گرنگی بـە زانسـتە کـانی مـرۆڤ دەدات لە رێگەی بەڵگـە هێنـانی زانسـتی دوور لـە ئـایین، لـە وێـوە دەڵێن ئایین زیادەو خوداش بوونی نییە.

زانسـتی ئەنسـروپولوجیا دەکەنـە بەڵگـەی ئیلحادیەکـەیان بـۆ تەنانەت راستی و ناراستی قورئان.

بە نموونە دەڵێن: قورئان هەڵبەستراوە، گوایە چەند بەسەر هاتێکی لەخۆ گرتووە وەرگیراوە هی خۆی نییە، لەوانە بەسەرهاتی لافاوی (توفان)ی نوح (د.خ.) دەڵێن کەلەپووری بابلییەکانە، هەروەها بەسەرهاتی پیاوانی ئەشکەوت وەرگیراوە لە سریانییەکان! لەگەڵ کۆمەڵێك گومانی بێ بنەمای تر کە هیچ پێوەرێکی زانستی پشگیریان نییە.

## جۆری حەفتەم: ئیلحادی کۆمەڵایەتی.

ئەم جۆرە ئیلحادە لە بانگراوندێکی کۆمەڵایەتیەوە هاتوە، واتا ئیلحادیکی عەقلانی نیە و هەڵقولاوی بەراوردێکی کۆمەڵگایە بە کۆمەڵگای رۆژئاوا، گوایە نزیك بونەوەی کومەڵگا لە دین هۆکارە بۆ پاشەکشەی کومەڵگا ئەمەش جۆرێکە لە هەمان بۆچونی مارکسیەکان دەچێت کە دەلێن: ( ئاین تریاکی گەلانە) . تێکەڵەیکی زۆریان کردوە لە نێوان کردەوەی مرۆڤەکان لەگەڵ دەقەکانی ئاین هەروەها عادات و تەقالید لەگەڵ شەریعەتی ئیسلام. بەم هۆکارە سەری کێشاوە بۆ ئیلحادێکی کۆمەڵایەتی .

## جۆری هەشتەم: ئیلحادی فەلسەفی.

ئـــەم جـــۆرە ئیلحـــادە بنـــەما ســـەرەکیەکەی لۆژیـــك وبـــوارە فەلسەفیەکانە، لە دوای عیلەت و معلل ە ، خێر و شـەڕ ، سـبەب و مسبیبات دەگەڕین، پێان وایە خودا هیچ کاریگەری و شـوێنەوارێکی لەســەر بونــەوەر دیــار نیــە ، پێشــەنگی ئــەم جــۆرە ئیلحــادەش لەبوچونەکانی نیتشە لە کتێبی ( الانسان السوبر) هەروەها شـوبنهار لە کتێبی (الارادة) هاتوە.

## جۆری نویەم: ئیلحادی ئەدەبی.

ئەم جۆرە ئیلحادە زیاتر بۆ دەرچوونە لە بەهاو قیەم و ئەخلاق لـە چوار چـێوەی بـەناو ئـازادی و بـۆ چوونی ئـازاد، لـە رێگـەی شـیعرو ئەدەب و بەسەرهات، بۆ دڕبڕینی بێ سنور لە چوار چێوەی غـەریزەی مرۆڤەکان، لەم رێگایەوە ئەوەی بیانـەوی سـنورەکان ببـەزێنن و هـیچ پیرۆزیك نەهێڵنەوە تا دەگاتە دەربڕینی نەبونی خودا، لەرێگەی شیعر و ئەدەبەوە ئەم جۆرەیان لە کوردستانیش سەری هەڵداوە لـە رێگـەی هەنـدێك بـەناو شـاعیرەوە تـەواوی سـنورەکانیان بەزانـدوە و بونەتـە رێگایێك بۆ ئیلحاد.

### جۆری دەیەم: ئیلحادی ( الا ادری ) نازانم یان سەر لێشێواو.

ئەم جۆرە ئیلحادە سەلبیات و ئیجابیاتی هەیە ، ئیجابیاتەکەی ئەوەی دەزانی ئەوە دروست کراوە لە لایەن خالیقێکەوە بەڵاّم نازانی و بەدوای دادەگەری نەی دۆزیوەتەوە، سەلبیاتەکەشی ئەم کەسە کەسێکی سەر لێشێواو نازانی لە کیێ وە هاتووە، بۆچی هاتووە؟ دەچێتەوە کیێ؟ کیێ درورستی کردوە خالیقەکەی کیێ یە ؟ تاسەردەکێشیێ بۆ ئیلحادێکی نەزان.

## نەسرانییەت نزیکترین ئایین و فیکرەیە لە عەلمانیەت و ئیلحاد:

درووشمی نەسرانی (ما لله لله وما للقیصر للقیصر) واتا خودا دەسەلاتی خۆی بۆ خۆیەتی و قەیسەریش دەسەلاتی بۆ خۆیەتی. عیلمانییەتیش دروشمی (فصل الدین عن الحیاة او عن الدولة) واتە جیاکردنەوەی ئایین لە ژیان یان لە دەوڵەتداری. هەر دووکیان لە ڕووی درووشمەوە بە مانای دوورخستنەوەی ئایین دێت لە تەواوی سێکتەرو جومگەکانی ژیان، کەواتە عەلمانییەت کاری سەرەکی ئاراستە کردنی مرۆڤەکانە بۆ لادان و دوورخستنەوەیان لە ڕووی بیرو باوەڕەوە بەرەو ئیلحاد، عەلمانییەت سەرچاوەو قۆناغی سەرهەڵدانی

ئیلحاد بوو جارێکی تر، ململانێی نێوان کەنیسەو پیاوانی مەسیحی لەگەڵ دەسەلاتداران، قورغکاری کردنی لە ڕووی پارەو سامانەوە بە ناوی ئایینەوە عەلمانییەتی هێنایە بەرهەم، عەلمانییەتیش بەشێوازی پەرچەکرداری لەبەرامبەر کەنیسە وپیاوانی کەنیسە دژایەتی بێسنووری بەرامبەر خودا و ئایینەکانی ڕاگەیاند. لەگەڵ لەدایکبوونی شۆڕشی فەرەنسی و عەلمانییەت فیکرەی ئیلحادی ودژە ئایینیش پەیدابوو، لە کۆتایی سەدەی حەڤدەم و سەرەتای سەدەی هەژدەم لە نێوان دەوڵەت و شۆرشی نوێی عەلمانی و کەنیسە و پیاوانی دەولەت بنیات کرا لەسەر دژایەتی کردنی ئایین بە گشتی و سەرهەڵدانی فیکرەی ئیلحادی بۆ جارێکی تر بە شێوازیکی جیاواز بە تایبەتی، لە ئەنجامی پێشکەوتنی تەکنەلۆجیا وبوارە زانستییەکان، رۆژئاوا بە دوای بیرۆکەی ئیلحاد و بڕوا نەهێنان بە خودای گەورە سەری هەڵداوە، ئەم چەرخە چەرخی : کارل مارکس، تشارلز داروین، فریدریك نیتشە، سیگموند فروید بوو، ئەوانەی دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوەی زانستی لەبارەی دەروونناسی و ئابووری و کۆمەلآیەتی هیچ رۆلێکیان بۆ خودای بوونەوەر کە اللہ یە نەهێشتەوە، بە پێچەوانەوە وایان نیشاندا کە ئایین دژە زانستە و بگرە رێگرە لە پێشکەوتنی زانستی دەبێت خەڵك لێی دووركەوێتەوە.

**سەرەتای بیرۆکەی ئیلحاد لای بیرمەند و کەسایەتییەکان کۆتایی سەدەی حەڤدەم و سەرەتای سەدەی هەژدەم، گۆمەڵێك بیرمەند سەریان هەڵداو چەند تیۆرییەکیان دارِشت بووە هۆکاری سەرهەڵدانی فیکری عەلمانی و ئیلحادی لەوانە:**

١- **کارل مارکس**، تیۆری (الدین أفیون الشعوب) ی دارِشت، ئەم تیۆرە بۆ کەنیسەو پیاوانی راستە بەلاّم بۆ ئایینی راستەقینەی ئیسلام ١٠٠٪ هەڵەیە، ئایینی پیاوانی کەنیسە دروست کراوی دەستی خۆیانە! چۆنیان بویَ ئاوا لێکی دەدەنەوەو زیادو کەمی دەکەن، لە پێناو بەرژەوەندی خۆیان بەکاری دەهێنن، بەلاّم ئایینی ئیسلام لە لایەن خوداوە دابەزێندراوە و پاراستنەکەشی لەسەر خودایە: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ (١٨). واتە: بەراستی ئێمە خۆمان ئەم قورئانەمان ناردۆتە خواریَ و، هەر خۆیشمانین ئاگادارو دەیپارێزین.

ئایینی عەقل و رووح و ژیری و فیترەتە، کۆتا پەیامە و گۆرِانی بەسەردا نایێت.

**٢- بەشێك لەئەدیب و شاعیرەکانیش بەشداربوون لە**

(١٨) الحجر: ٩ .

**بلاْوکردنەوەی ئیلحادو راگەیاندنی.**

که بیرۆکەی ئایین-خودا مردووەو کۆتایی پێهاتووه له وانـه(ولیام بلیك)(١٧٥٧-١٨٢٧) دەڵێت: (إن الدين أبعد الإنسان من إنسـانيته بفرضه قوانين تعارض طبيعة البشـر مـن ناحيـة الحريـة والسـعادة وأن الدين جعل الإنسان يفقد حريته وإعتماده على نفسه في تغيير واقعه). واتــه بەراســتی ئــایین مــرۆڤ دوور دەخاتــەوە لــە مرۆڤایــەتی خــۆی بەسەپاندنی یاساکانی پێچەوانەی سرووشتی مرۆییه لـه ڕووی ئـازادی و بەختەوەرییەوە، و بە راستی ئایین ئازادی مرۆ ڤ لـه دەسـت دەدات، وا له مرۆڤ دەکات پشت بە خۆی نەبەستێ بۆ گۆڕنی واقیعی خۆی.

٣- **فەیلەسـووفی ئـەڵمانی ئارســەر شـوبنهاور:** (١٧٨٨-١٨٦٠) بیرۆکـەی (الــدين هــو مــن صــنيعة البشــر) ی دانـا واتــە: ئــایین دروستکروای مرۆڤه ئەم بیرۆکەیە لەگەڵ تیـۆری داروینـ هەماهـەنگ بوون پشتگیری یەکتریان کرد.

٤- **نیتشه** بیرۆکەی مردنی (الخالق الأعظم) بلاْوکردەوە و دەڵێـت: (إن الـدين فكـرة عبثيـة وجريمـة ضـد الحيـاة) واتــه: بەراسـتی ئـایین بیرۆکەیەکی گاڵتەجارییەو تاوانێکه بەرامبەر ژیان.

٥- **سیگموند فروید** دەڵیت: (أن الـدين هـو وهـم كانـت البشـرية

**بحاجة إليه في بدايتها وأن فكرة وجود الأله هي محاولة من اللاوعي للوصول إلى الكمال في الشخص)** واتە: بەراستی ئایین خەیاڵێکە مرۆڤایەتی لەسەرەتای هاتنی پێویستی پێ بووە و بیرۆکەی بوونی خودا هەوڵێکە لە ئەنجامی بێ ئاگایی بۆ گەییشتن بە تەواوکاری لە کەسەکان.

## مەبەست و مەرامی ئیلحادو پاڵنەرە سەرەکیەکانی؟ شێوازی بڵاوبونەوەی؟

بە ووردبوونەوە لەهەر یەك لە ووتەو بیرۆکەی مارکس و ولیام بلیك و شوبنهارو نیتشەو فرۆید، ئەم خاڵانەی خوارەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە پەیوەندییان بە سەرتاییێکی نوێیە بۆ بڵاوکردنەوەی ئیلحاد لە ژێر فیکری عیلمانی و مەرامەکانی:

١- وێناکردنی ئایین بە تلیاك و سەرخۆشکەری گەلان سەرەتای دروستکردنی بیری ئیلحادییە.

٢- ئەگەر ئایین دژی سرووشتی مرۆڤ بێت وەك ولیام بلیك دەڵێت، چۆن کاریگەری لەسەر دامەزراندنی بیری ئیلحادی نابێت لەسەر تازە پێگەیشتووەکان.

٣- شوبنهاور ئایین بە دروستکراوی مرۆڤ لێکدەداتەوە، ئەکەر ئایین مرۆڤ دایبنابێت کەواتە خودا نییە! یان بە لایەنی کەم مرۆڤ پێویستی بە خودا نییە، ئەمەش جۆرێکە لەسەرتای ئیلحاد.

٤- ئگـەر بێینـە سـەر بیرۆکـەی نیتشـە کـە دەڵێـت خـودا یـان دروسـتکەری گـەورە مـردووە ئـایینیش گاڵتـە جاڕییـە ئەمـەیان سەرکێشیەکی گەورەیە بۆ سەرهەڵدانی ئیلحاد.

٥- فرۆیـد بـەردی بناغـەی ئیلحـادی دارشـت بـە بڵاوکردنـەوەی تیۆرەکەی کە پێ وایە بیرۆکەی بوونی خـودا کـارێکی نـا سرووشـتییە ئایینیش خەیاڵەو هیچی تر.

ئەم بیرۆکانە بە گشتی بـە شـێوازێکی پلـە بەنـدی بـەرەو ئیلحـاد ئاراسـتەی وەرگـرت و لەگـەڵ ڕووداوە سیاسـییەکان کـە فەرەنسـا بـە خۆیـەوە بـینی لـە دوای شۆڕشـی فەرەنسـی، هـەروەها بـەرەیتانیا و ئیتاليا دەتوانین بڵێین روژئاوا بە گشـتی بیرۆکـەی (فصـل الـدين عـن السياسة أو الحياة) ی لێکەوتەوە و دواتر داگیرکـەرانی ئـەوروپا هـاتن جیهانی ئیسلامییان داگیرکردو هەمان بیرۆکـەیان لـە ڕێـی سـەرکردە دروستکروەکانی خۆیـان لـە جیهـانی ئیسـلامی دامەزرانـد، کەسـانی وەك جمال عبدالناصر، أنور السادات، القزافي، زين العابدين، میشـیل عفلق و صدام حسين ، حسنی موبارەك و ئال سعود و سەرکردە بـەناو ئیسـلامی و نـاوەرۆك و حیزبـی عیلمـانی کـرد بـە دەسـەڵاتدارو لـەو ڕێگەیەوە واتە لە ڕێگەی عەلمانیتەوە بیری ئیلحادیان بلاکردەوە.

ولاًتانی ئیسلامیان لە نیًوان خۆیاندا دابەش کرد. جەزائیر بوو بە ژێر دەستەی فەرەنسا یەمەن بوە ژێر دەستەی بەریتانیا، مصر و تونس و سودان و لیبا و مغریب هەر یەك بۆ ئەوانە دابەش کراوون. سەرەتایەك دەستی پێ کرد بۆ گواستنەوە و تیًکەڵ کردنی فکری عەلمانی بە جیهانی ئیسلامی، بەبێ ئەوەی لەم سیاسەت و دەولەتداریە نۆییە ئایین هیچ دەورێکی هەبێ. لەم نێوەندەدا جیهانی ئیسلامی کەوتە دڵەڕاوکێ و بە دوو ڕیانی عەلمانیەت و ئیسلام کامیان هەڵبژیری بۆ ژیان؟ . لەگەڵ کاروانی ئەوروپا و شارستانیەتەکەی هەڵبکات یان دەست بو ئەخلاقی ئیسلامیەوە بگرێ؟ بەشێك بەتەواوی بۆ بەرژەوەندی خۆیان تێکەڵ بە فکری عەلمانی بون و پشتیان بە تەواوی لە ئیسلام کرد!، بەشێکی وەك کاردانەوە ڕێگای سەلەفیەتیًکی زۆر توندیان گرتە بەر بەبێ روح و مقاصیدی ئیسلامی، بە شێکی تریشیان هەوڵیان دا ئیسلام و شارستانیەتی رۆژئاوا تێکەڵ بکەن و وەری بگرن لەوێوە زاراوەی: (الدیمقراگیە الاسلامیە ، الاحزاب الدینیە ، الدولە المدنیە) پەیدا بوو، لێرەوە بیرۆکەی ئیلحاد لە رێی فکری عەلمانی دزەی کرد بۆ جیهانی ئیسلامی. داگیرکارەکانی بەناوی ئاوەدانکردنەوە ولاًتەکانیان داکیر کرد!. هەروەها لە رێگای ناردنی دەستە دەستەی خەڵك بۆ رۆژئاوا و گواستنەوەی بیرو کلتوری رۆژئاوا بۆ جیهانی ئیسلامی و سەرسوڕمان بون دەستیان بە تەقلید کرد وەك: (ابن خەلدون)

دەفەرموێ گەلی لاواز چاولێکەری بەهێزەکان دەکات، جیهانی ئیسلامیش چونکە توشی شکست هاتوون و روخان و بە ئاسانی تەسلیمی دەستی رۆژئاوا بون، دەسەلاتدارو حیزبە عەلمانیەکانی جیهانی ئیسلامی بە پاڵپشتی رۆژئاواو و ولاتە زل هێزەکان دەستیان کرد بە بلاوکردنەوەی فکری عەلمانی لە لایەك و دژایەتی کردنی ئیسلام و بنەما و بەهاکان لەلایەکی تر. لەرێ دام دەزگا و شوێنە گرنکەکانی حکومەت فکری ئیلحادیان بلاو کردەوە ئەمە وەك سەرەتایەك بۆ پەیدا بونی کاری ئیلحادی لە رۆژهەلاتی ناوەراست .
رۆژئاوا توانی لە رێی چەند وەسیلەێکەوە بازاری بیری عەلمانی بجولێنێ و گرنگی پێ بدات لەوانە:

## یەکەم: لە رێگای داگیرکاری سەربازی بەناوی ئاوەدان کردنەوە:

بیری عەلمانی لە زۆر لایەنەوە پێچەوانە و دژە لەگەڵ عەقڵ و لۆژیك و واقیع و سروشتی مرۆڤ، بۆیە لە رابردوو ئیستادا پێویستی بە هێزی سەربازی بوە بۆ بلاوکردنەوەی و خۆ سەپاندنی بەسەرگەلاندا بەتایبەتی لە جیهانی ئیسلامی، ئێستا حیزبەکانی جیهانی ئیسلامی کە لەدەسەلاتن بە زۆر ماونەتەوە ، بە زەبری چەك و هێز و داگیر کاری و داپۆشینی خۆیان سەپاندوە، تەنانەت لە کاتی هەڵبژادنەکانیش بەزۆری زۆرداری بەتەزویرکردن و چاو سورکردنەوە

خۆیان دەگەیینە دەسەلاٌت، بۆیە رۆژئاواش لەسەرەتا بۆ پەراندنـەوەی بیری عەلمانی بۆ جیهـانی ئیسـلامی پێویسـتی بـە هێـز هـەبو هێـزی سەربازی بەکار هێنا .

## دووەم: لە رێگەی ناردنی دەستەی زانستی بۆئەوروپا بەناوی فێر بوونی زانستی و پێشکەوتن:

دەستەو تاخمیـان رێکخسـت لـە ولاٌتـانی جیهـانی ئیسـلامی بەناوی فێربوون و زانستی سەردەم و پێشکەوتن، وە بەناوی خوێنـدنی کیمیا و فیزیا و فەلەك ناسی و جیولۆجی، لەبرِی وەرگرتنی زانسـت و زانیـاری بـیرو کلتـوری رۆژئاوایـان هێنایـەوە جیهـانی ئیسـلامی ، بەشـێکی زۆر بـەناوی رۆشـەنبیرانی جیهـانی ئیسـلامی بـون بـە بانگەشەکاری فکری عەلمانی و ئیلحادی لەوانە: ( تەهاحسین، رفاعـە التهتاوی، فۆاد زکزیا ، عبدالرحمان بدوی ، محمود امین ، زکـی نجیـب ) چەندین کەسی تر ، بە هۆی ئەم بەناو رۆشـەنبیرانەوە گەرانـەوە بـۆ جیهانی ئیسلامی لـە جیـاتی پـاریس و واشـنتن، پایتـەختی ولاٌتـانی رۆژهەلاٌت ئەمجارەیان بغداد و قاهیرە و دمشق بون بە سەرچاوەی بـلاٌو کردنـەوەی بـیری عــەلمانی و ئیلحـادی!، هۆکارەکەشـی ئـەم نێـردە زانستیانە بە نەخشە رێگاو مەبەسـتی بەعـەلمانی کردنـی رۆژهـەلاتی ناوەراست بوو نەوەك زانست و بێشکەوتن .

## سێیەم: لە ڕێگای ناردنی دەستەو تاخمی تەبشیری:

نزیکترین ئاینی دەستکرد لە عەلمانیەت ئاینی دەستکاری کراوی نەسرانیە ، دوای داگیر کردنی جیهانی ئیسلامی لەلایەن رۆژئاواوە ئەم جیهانە بو بە خاکێکی بەپیت بۆ چاندنی تەواوی بیرو باوەری عەلمانیەت و بیری ئیلحادی، ئەوان بەناردنی دەستەو تاخمی زۆر تەبشیری بۆ بلاۆگردنەوەی فکری عەلمانیەت لەجیهانی ئیسلامی دەستیان پێ کرد، هەڵگری فکری تەبشیری هەندێکیان سەر بە رۆژئاوا بوون: وەك زومیردنلوب، یان سلامە موسی، جرجی زیدان. وێنەی ئەوانە، هەندێك لەوانە بەبەرگی ئیسلامی بیری عەلمانیەتیان بلاۆدەکردەوە، هەندێکیان بە ئاشکرا عەلمانیەتی خۆیان راگەیاند ئەمەش بوە رێگایەکی تری بۆ بلاۆکردنەوەی فکری عەلمانی و سەرەتای ئیلحاد.

## چوارەم: لە ڕێگەی کردنەوەی قوتابخانە و زانکۆی بیانی:

سەرەتا لە رێگەی قۆناغەکانی پیشو هەروەها تەبشیریەکان رێگەیان خۆش کرد خەڵکیان ئامادەکرد ئینجا دەستیان کرد بە کردنەوەی قوتابخانەو زانکۆیان لە جیهانی ئیسلامی کردوە ، وەك زانکۆی ئەمریکی لە بیروت، چەندان زانکۆ و قوتابخانە بە پەیڕەو

مەنهەجی تەبشیری و رۆژئاواییەکان، ئەم شوێنانەیان کردە دەرگایەك بۆ پێگەیاندنی نەوەیەکی نوێ کە هەڵگری فکری عەلمانی بون ، تا ئێستاش ئەم هەنگاوە درێژەی هەیە و بەردەوامن لە بە عەلمانی کردن و ئیلحادی فکری . لە کۆتای دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی ماسونیەت و عەلمانیەت دەسەڵاتیان بەسەر جیهانی ئیسلامیدا سەپاند، وردە وردە رێیان بە دەزگا و رێکخرلوەکانی تەبیشیری دا زانکۆ و قوتابخانە لە جیهانی ئیسلامی بکەنەوە.

## پێنجەم: لە رێگای دەزگا و رێکخراو و حزبی عەلمانی.

بەم رێگایانەی لە پێشدا باسمان کرد ماسونیەت و رۆژئاوا چەندان کەسیان لە قاڵبی لیبرالی و شوعیەت و قەومی و عروبە و چەپگەریان دورست کرد، لە جیهانی ئیسلامی ، ئەوانە بە جیهانی ئیسلامی دا بلاۆبونەتەوە دەستیان کرد بە دورست کردنی حیزبی عەلمانی و ئیلحادی، هەموشیان یەك دەنگ بون لەسەر بلاۆکردنەوەی فکری عەلمانی، هەروەها دەیان دەزگا و رێکخراوەیان دورست کرد لە ژێر ناوی نیشتمان و قەومی بۆ هەڵخەلەتاندنی خەڵك، ئەوەی جێ سەرنجە بەشی هەرەزوری ئەوانەی دامەزرینەری حیزب و رێکخراوەکان بوون مەسیحی بون بە نمونە: حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی میشل عەفلقی مەسیحی دایمەزراند، هەروەها جورج حبش

یەکێکی تر بوو لەوانە بە شێکیشیان دەوڵەمەندە یەهودیەکان بون وەك (کوریك).

## شەشەم: لە ڕێگای دەزگاکانی ڕاگەیاندن.

لە ڕێگەی بینراوو بیسراو و نوسراوەو جیهانی ئیسلامیان پڕکرد لە فکری عەلمانی ، ئەوانەی کاریان لە راگەیاندنەکان دەکرد، یان نەسرانی بون یان موسڵمانی هەڵگرانی فکری عەلمانی بون، توانیان بە شێوازێکی نەخشە بۆ دارێژراو لەرێی هونەر و بوارە کۆمەڵایەتیەکان لەو ڕێیەوە عەلمانیەت و فکری ئیلحادیان گەیاندە هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگا.

## حەفتەم: لە ریگای چاپ کردنی کتێب و نامیلکەو گۆڤارو ڕۆژنامە.

عەلمانیەت بەناوی ئەدەب و هونەرو فکر و نۆێگەری و داهێنان خویان دەرخستن لە جیهانی ئیسلامی ، لەژێر ئەم دروشمانە هەوڵی ڕەش کردنەوەی هەموو شتەکانی پێش خۆیاندا ، گوایە بەسەرچون و باویان نەماوە، بەتایبەتی بەها بالاکان و ئەخلاقی ئیسلامی و شارستانیەت و بوارە رۆشەنبیرەکان، چەندان نوسەری عەلمانی و مولحید دەستیان بە بلاوکردنەوە بیری عەلمانی و ئیلحادی لە رێی

زانستی ڤیکری و ئەدەبی و سایکولۆژی وکۆمەڵناسی و زانستە مرۆییەکان کرد لەژێر ناوی ئەدەب و هونەر.

## هەشتەم: لە ڕێگەی نێردەی دبلوماسی و بەخشینی خوێندنی بەخۆرایی .

لەم قوناغە رۆژئاوا هەموو جۆر و رێگاکانی بەکارهێنا بۆ بڵاوکردنەوەی بیری عەلمانی و ئیلحادی، چەندان نێردەی دیبلوماسیان لە رۆژئاوا هێنایە جیهانی ئیسلامی، هەروەها بە پێچەوانەوە. لەگەڵ پێدانی خوێندنی بەخۆڕایی لەناو زانکۆکانی خۆیان لەڕێی ئەوانەوە بیری رۆژئاواییەکانی نارده جیهانی ئیسلامی.

## نۆیەم: لە ڕێگای کردنەوەی کۆمپانیا زەبەلاح ، بەناوی بەهێزکردنی ئابوری.

دیاره کۆمپانیاو بواری ئابوری و کاریگەریان زیاتره لە زۆرێك لەدەزگا و رێکخراوەکان بۆ ئەوەی بیری عەلمانی و ئیلحادی تێدا بڵاوبکەتەوە، چەند کۆمپانیایەکی زەبەلاحیان لەجیهانی ئیسلامی کردوە بەناوی پێشخستنی بواری ئابوری، کردیانە وێستگەیەکی بە هێز بۆ بەلا ڕێدابردنی کۆمەڵگا، بەزۆری لەلایەنی دوو وڵاتی زلهێزی وەك بەریتانیا و وەئەمریکا پێشگیری دەکران و نەخشەیان بۆ دادەنرا.

## دەیەم: لەڕێی بەخشینی پارەو كڕینی خەڵكی بێ مەبدئ.:

لەهـەموو سـەردەمێك خـەڵكی مـادی و بەرژەوەنـدی خـوازو بـێ مەبدەئ هەیە ، عەقیدەو ئیمان و قیەمی خـۆی دەدۆڕێنـی بـۆ بڕێـك پارەو و پـول و مەنسـەب ، ڕۆژئـاوا زۆر زیرەكانـە دیراسـەی جیهـانی ئیسـلامی كـرد رەواجـی بەعەلمانیـەت و ئیلحـاد دا، كەسـانی بـێ مەبدەئی بـەپارەو سـامان كـڕی، لـە ریّـی ئەوانشـەوە كاریـان لەسـەر خـەڵكی تـر كـرد، توانیـان دەسـت بخەنـە نێـو جەرگـەی كۆمـەڵگـەی ئیسـلامی و دوریـان بخەنـەوە، سـەرەتا لـە ئـەخلاق و دواتـر لەبـەها بالاكـان و ئینجـا شارسـتانیەت و رۆشـەنبیری تـا لەكۆتاییـەكانی سەرلەعەلمانیەت و ئیلحاد دەردەكات.

## هەڵوەستەیك

دیارە ئەم رێگایانــە لــە تــەواوی جیهــانی ئیســلامی بــەكارهاتون، هیچ وڵاتێكی ئیسلامی نەبو ئــەم هیرشــانەیان لەســەر نــەكرێت ، بــێ گومــان وەك گوتمــان كوردســتانیش بەشــێكە لــە جیهــانی ئیســلامی هەمان كارێگەری لەسەر دروست كراوە، ئەم رێگا و پیلانەی رۆژئــاوا گرتیتەبەر بۆ بڵاوكردنەوەی فكری عەلمانی و بیری ئیلحــادی تــا ئێســتا بەردەوامە، بــە جیــاوازێكی زۆر كەمــەوە ئەگــەر نــا هــەمان هــەنگاو رۆژانە دوهاوێژرێت و ئامانجەكانیان پێكاوە.

### هەڵوەشاندنەوەی ئیلحاد:

هەرچــەندە وەك لەپێشــدا ئامــاژەم پــێ كــرد بــیری ئیلحــادی لــە كوردستان زۆر لاوازە، رەواج پێ دانی بۆمەرامی سیاسی و شكســتی بــیری عەلمانیەتــە، نــەك قەناعــەت و زانســت ولۆژیــك. بــەڵام لەگــەڵ ئــەوەش پێویســت دەكــات بــۆ هەڵوەشــاندنەوە و ڕوبــەڕو بونــەوەیان بەرچــاومان روون بێــت و شــێوازی زانســتیانە بگرینــە بــەر تــا گەشــە نەكات و زوو بیرۆكەكە هەلوەشێتەوە. دەكرێ ئیلحاد پۆلین بكەین بــە سێ جۆر لەكاتی كاركردن لەسەر هەڵوەشاندنەوەی بیرۆكەكەیان.

١- ئیلحادی دژ و دوژمنایەتی: ئەمەیان بونی خودا بەتەواوی رەت دەکاتەوە و دژی بیرۆکەکەی دەوەستێتەوە.

٢- ئیلحادی دوو دڵ و نازانم: ئەم جۆرەیان یەکلانەبۆتەوە بە هیچ لایەکدا نە ئیمانی تەواو بە بوونی خودا هەیەو نە بەنەبوونی.

٣- خودا دروست کارەو بونەوەری دروست کردوە بەڵام وازلێهێناوە: ئەم جۆرە ئیلحادە پێیان وایە بوونەوەر، خودا دروستی کردووە بەڵام لەدواییدا پێی بەرێوە نەچووەو وازی لێهێناوە.

بە پێی ئەم پۆلێنە ئەم جۆرانە تا ڕادەیەك هەلوەشاونەتەوەو هیچ کاریگەریەکیان لەسەر واقیع نەماوە وەك بیرۆکەی ئیلحادی لەبەر لاوازی و نەبوونی بەڵگەی سەلمێندراوە، ئەوەی گرنگە قسەی لەسەر بکرێت و هەولی هەلوەشانەوەی بدرێت ئیلحادی ئەم سەردەمەیە کە ئەم پێنج نووسەرەی باسم کرد، لە پێشدا لە رێی کتێبەکانیانەوە هەروەها بە جۆرێك لە رێگای فیزیاو زانستیانە دەیانەوێ ئیلحاد بچەسپێنن و (تأصیل) بکەن و دەلیلی سەلمێندراوی زانستی بۆ بهێننەوە، بێ گومان تەواوی بەڵگەکانیان لە ڕووی عەقلی و زانستی و لۆژیك و واقیع و بێ گومان ئایینەکان بە گشتی ناتەواو و لاوازو سەلمێندراو نین.

بابەتەکەی ئێمەش زیاتر قسە لەسەر مەرامی ئیلحادە، لەگەڵ چۆنیەتی ڕووبەڕو بوونەوەی فیکری ئیلحاد، ئەگەر نا دەبوو وەڵامێکی پوختی بدرێتەوە، بەهەرحاڵ بە کورتی چەند خاڵێك باس دەکەین بۆ ڕوبەڕو بوونەوەو هەڵوەشانەوەی بیری ئیلحاد، لە وانە:

١- لەسەر هەموو تاکەکان پێویست نییە کار لەسەر چۆنیەتی هەڵوەشانەوەی بیری ئیلحادی بکات، بەڵام زۆر پێویستە هەموو تاکەکان ئیلحاد بناسن، بزانن چۆنن؟ کێن؟ بیرۆکەیان چییە؟ مەرامیان چییە؟ چونکە ناسینی شت وەك خۆی نیوەی وەڵامە.

٢- خۆشارەزاکردن لە بیرۆکەی ئیلحادو هەروەها بەڵگەو دەلیلەکانی یەکتا پەرستی و هەماهەنگیان لەگەڵ بوونەوەر و مرۆڤ.

٣- ووشیاری گشتی بۆ تاکەکان لەسەر پاڵپشتی ئیلحاد، هەروەها لەسەر ڕەوڕەوەی مێژووی یەك لەدوای یەکی ئیلحاد، بەچەند جۆر هاتوون و چۆن هەڵوەشاونەتەوە.

٤- گرنگیدان بە بواری باوەڕ (عقیدە)و بەهاو بوارە فیکرییەکان.

٥- بەهێزکردنی بوارە ئیمانییەکان بە سوود وەرگرتن لە زانستی سەردەم.

٦- نووسین و لێکۆڵینەوەی زانستی لەبارەی ئیلحاد.

٧- ئامادەکردنی ستافی ڕاهێندراو بۆ حیوار و گفتوگۆ ونیقاش و ڕەتدانەوە.

٨- ئامادەکردنی بازنەی نیقاشی بەرپەچدانەوەی زانستی لە چوارچێوەی هەڵوەشانەوەی ئیلحاد.

٩- گرگیدان بە بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی و واقیعی بوونیان.

١٠- گرنگیدان بە ئیعجیازی زانستی.

١١- هەڵوەشاندنەوەی تۆرەکانیان بە بەڵگەی زانستی.

١٢- تەرخانکردنی ماڵ و سامانێکی دیاریکراو بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم بابەتە.

١٣- گرنگیدان بە بواری ڕاگەیاندنەکان بۆ وەڵامدانەوەی بواری ئیلحادی.

١٤- کردنەوەی سەنتەری لێکۆلینەوەی ستراتیژی و فیکری.

١٥-گرنگیدان بە بەهێزکردنی خێزان لە ڕووی باوەڕی (ئیمان)و فیکرییەوە.

١٦- زیندووکردنەوەی ڕۆڵی مزگەوت.

١٧- خۆخزاندنە نێو قوتابخانەو زانکۆکان بۆ ووتنەوەی وانەی فیکری ئیسلامی و هەڵوەشاندنوەی فیکری ئیلحادی.

١٨- بە هێزکردن و گرنگیدان بە لایەنی تەزکیەو ڕووح.

١٩- گرنگیدان بە خوێندنی زانستە شەرعییەکان.

**٢٠- زۆر گەورە نەکردنیان زیاد لە قەبارەی خۆیان بەڵکو وەك خۆیان کە هەن مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت.**

## دەرئەنجام:

١- لەهەرێمی کوردستان ئیلحاد نەبوتە دیاردەو زور دەکمەن و لاوازن.

٢- دەبێ لەگەڵ بابەت و بیروکەی ئیلحاد وەك و خۆی هەلسەوکەوتی لەگەڵ بکەین واتە لەقەبارەی خۆی زیاتر گەورەی نەکەین، قەبارەی لاوازەو نابێ زور گرنگی پێ بدرێ.

٣- ئیلحاد لەکوردستان قەناعەت و زانست نیە زیاتر تەقلیدو پەرژەوەندیە.

٤- عەلمانیەت لەهەرێمی کوردستان پاڵپشتی سەرەکی ئیلحادە.

٥- عەلمانیەت لەهەرێمی کوردستان شکستی فکری هیناوە ناتوانی زیاتر بەرگەی ئیسلام بگرێ پەنا دەباتە بەر ئیلحاد بۆ مانەوەی خۆی.

٦- تا ئاستی زانست و تەکنەلۆژیا بەرز بێتەوە ئیلحاد ڕو لەدابەزینە. تا نەزانی و جەهالەت بەرز بێتەوە ئیلحاد گەشە دەکات.

٧- رۆژئاوا زور قوناغی بڕیوەو زۆر بیرۆکەی تاقی کردوتەوە لەتەواوی بیروکەکان شکستی هێناوە بێ گومان لەئیلحادیش هەمان چارە نوسی دەبێت.

**٨- كومـەڵگای كـوردی تـەواو لەگـەڵ بـەهاو ئاكـارو ئـەخلاقی ئیسلامی تێگەڵەو ئاوێتە بوە هیچ، ئیلحـاد مەترسـیەك نیـە لەسـەر گومەڵگای ئێمە.**

**٩- ئیلحاد پێچەوانەی فیترەت و لۆژیك و واقیـع و مـرۆڤ بـون و شەرعە بۆیە گەشە ناكات.**

**١٠-زۆر بابـەتی گـرنگتر هەیـە پێشـی ئیلحـاد پیویسـتە كـاری لەسەر بكەین تا نەگاتە ئاستی ئیلحاد لەوانە: بەهاو قیم و عەقیـدەو فكرو هوشیاری ....هتد.**

بەپشتیوانی خودا تەواو بوو لەبەرواری، **٢٩-٣-٢٠١٩**، ز، هەولێر.

## سەرچاوەکان

معجم مقاييس اللغة، لابن فارس.

الالحاد في الغرب، د رمسيس عوض.

الالحاد المعاصر وكيف نجابهه ، نيافة الأنبا غريغوريوس.

جامع البيان عن تأويل آي القران، للقرطبي.

مجلة الوعي الاسلامي الكويتية العدد(٥٧٧) مقال بعنوان هل حقا الدين افيون الشعوب.

خلاصة العتاد في مواجهة الإلحاد أحمد خالد الطحان .

# پێڕست

مەبەست و مەرامەکانی

# ئیلحادی هاوچەرخ

هەرچەندە ئیلحاد، مێژوویێکی دوور و درێژی هەیە، لە ڕەوڕەوەی ژیانی مرۆڤایەتیدا.

لە وەتەی مرۆڤ هاتۆتە سەر زەوی، کەم، تا زۆر، ئیلحاد هەر هەبووە، لەوانەیە کۆتایی پێ نەیێت، تا مرۆڤ لەسەر زەوی کۆتایی پێدێت.

یەکێک لە هۆکارە هەرە سەرەکییەکانی هاتنی ئەم ڕێژە زۆرەی پێغەمبەران ( سەلامی خودایان لێبێ ) بۆ مرۆڤایەتیی بەگشتیی، نەهێشتنی ئیلحاد بووە.

جیهانی ئیسلامی، لە دوای هاتنی وەحیی، بووە کانگای هاتنی پێغەمبەران بەگشتیی، بۆیە ئەم ناوچەیە کەمترین ڕێژەی ئیلحادی بەخۆیەوە بینیوە.

بەهۆی دابەزینی سەرجەم پەیامەکان لەم شوێنەوە، وای کردوە پێغەمبەران بەدوای یەکدا بێن، هیچ کاتێکیش ئەم شوێنە خاڵی نەبووە لە بوونی پێغەمبەرێک، یان زیاتر، مرۆڤەکانیش، هەتا لە پەیام و پێغەمبەران نزیک بن، دوورتر دەبن لە ئیلحاد و، نزیکتر دەبن لە تەوحید.

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice
نرخی 1000 دینار